# چەنـــد

# سەرنجێك دەربارەی

# هۆزەكانی كوردستانی خواروو


**مێجەر ئی. ب. سۆن**

**ئەفسەری سیاسی، خانەقی**


**لە ئینگلیزییەوە وەرگێڕانی بۆ كوردی،**

**پەراوێز و پێشەكی**

**نەجاتی عەبدوڵڵا**


**بنكەی ژین**

**سلێمانی** 2007

920,5321
م 459 مێجەر سۆن
چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو/ دانانی مێجەر سۆن؛ لەئینگلیزییەوە وەرگێڕانی نەجاتی عەبدوڵلا.ــ
سلێمانی: بنکەی ژین، 2007.
222ل: (14,5×21 سم)، بەڵگەنامە، ئەلبوومی وێنە، ئیندێکسی ناو.
1–هۆزو خێڵاتی کورد– کوردستانی خواروو– لێکۆڵینەوە 2–نەجاتی عەبدوڵلا (وەرگێڕ) 3–ناونیشان
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پێرستو پۆلێنی ئامادە کردووە

**سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح**

زنجیرە: 69
کتێب: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو
نووسینی: ئی.ب. سۆن
بابەت: مێژوو و ئەتنۆگرافیا
لەئینگلیزییەوە وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵلا
تایپ و مۆنتاژ و هەڵەچنی: وەرگێڕ
بەرگسازی: قادر میرخان
خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
تیراژ: 1000
نرخ: 2500 دینار
ژمارەی سپاردن: 721ی ساڵی 2007
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

لەم سەرچاوەیەوە وەرگێڕدراوە: Major E. B. Soane, Notes on the Tribes of Southern Kurdistan, Government Press, Baghdad, 1918.

لە بڵاوکراوەکانی
**بنکەی ژین**
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستان: سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی 105، کۆڵانی 5، خانووی 23
نۆرماڵ: 3129102 ئاسیا: 07701565864 یا 07701464833 سانا: 1128309
سنووقی پۆست: 14 E. Mail: bnkaizhin@yahoo.com

# پێشەکی وەرگێڕ

ڕەنگە یەکێك لە لایەنە زۆر دیار و بەرچاوەکانی مێژوو و کۆمەڵگەی کوردەواری بۆ خۆی بریتیبێ لە مێژووی هۆز و عەشیرەتگەری و ئەمە ڕەنگە بەو مانایەش بێت کە قسەکردن لەسەر خێل و هۆزی کورد بۆ خۆی قسەرکردن بێ لەسەر مێژووی کورد. ئامادەبوونی خێڵ لە کۆمەڵگەی کوردیدا هێندە بەهێزە کە هەموو کولتوور و مێژووەکەی بەجۆرێك لە جۆرەکان بریتییە لە مێژووی خێڵ و هۆزەکان.

ڕاستە خێڵ و دەوڵەت لە تیۆریای زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا نوێنەری دوو سیستمی کۆمەڵایەتیی جیاوازن کە لە ناکۆکییەکی بەردەوام دان، بەڵام ئەمە هەرگیز بەو مانایە نییە کە بوارێك نەبێ بۆ پێکەوەژیانی دەوڵەت و خێڵ. مێژووی ڕۆژهەڵات ئەوەمان پێدەڵێ کە، تاوەکوو سەرەتای سەدەی بیستەمیش ناکۆکییە ئیتنیکییەکان لە پێوەندییەکانی نێوان دەوڵەت و خێل دا هەرگیز ئەو هێزە کاریگەرە نەبووە. بەپێچەوانەوە پێوەندی نێوان ئەم دوانە لەسەر توانای عەسکەری، سەرچاوەی ئابووریی و توانای ڕاگرتنی یەکسانیی هێز ڕاوەستابوو و جیاوازییە نەتەوەییەکان

هەرگیز ئەو کاریگەرەییەیان نەبووە. بەشێك لە ئانترۆپۆلۆگ و سۆسیۆلۆگە ڕۆژئاواییەکان لە ڕوانگەی خوێندنەوەییێکی تەواو تیۆرییەوە پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە خێڵ چەمکێکی دەوڵەت نەویستە و دابڕانێکی گەورە لەنێوان خێڵ و دەوڵەتدا هەیە. بە قسەی پاتریشا هۆزەکان فاکتەرگەلی پێشکەوتن نین و هیچ ڕۆڵێکیان لە دروستکردنی دەوڵەتدا نییە. خێڵ بە ڕوویێکی تایبەتی لەسەر پێوەندییەکانی خزمایەتی دەوەستێ و لە ڕوانگەی سترەکتووری وەچەکان پێناسە دەکرێ و دەوڵەتیش لەسەر پێوەندییە نا کەسییەکان و بەندیوارییە پەیمانبەستییەکان دەوەستێ[1]، بەڵام لە ڕۆژهەڵاتدا تەواو بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە خێڵ و دەوڵەت هێندە تێکەڵن کە خێڵ نەك هەر گروپێکی دەوڵەت ڕەفزکار نییە، بەڵکو ئەوە دەوڵەتە کە خێل دروستدەکات. ڕیچارد تاپەر، ئانترۆپۆلۆگی بریتانی هەقی بووە کە بڵێ " بە ڕوویێکی دیکە لە ناو هەر هۆزێك دا دەوڵەتێك هەیە و لەناو هەر دەوڵەتێکیشدا هۆزێك هەیە. دەوڵەت بە شێوەیەکی بەشیی (جزئي) لە ڕێگەی هۆزەوە دەناسرێ و هۆزیش لە ڕێگەی تێرمی دەوڵەت" دا[2]. لە چەند دەورانێکدا دەوڵەت بۆڕاگرتنی بالانس لە نێوان ئەکتەرەکاندا هەتا هۆزیشی دروستکردووە. لە ڕۆژهەڵات

---

[1]R. O. Christensen, « *Tribes, States and Anthropologists* », In *MES*, V 22, n° 2, April 1986, p. 290.

[2] Richard Tapper, «Introduction », In *The Conflict of Tribe and State in Iran and Afghanistan*, Londres, Ed. Croom Helm, 1983, p.67.

دەوڵـەت لەیـەك كاتـدا هـەم هـۆز دروسـتدەكات و هـەم لەنا ویـشی دەبات. بـەڵام دەبـێ لێـرەدا ئامـاژە بـەوە بكـرێ كـە، وەك مـارتن ڤـان بروێنـسن گووتـەنی" نـە هـۆزە كۆچـەرە گـەورەكان و نـە ئیمارەتـە (كوردییــەكان) بــە واتــەی تــەوای وشــەكە دەســتكردی دەوڵــەتی عوسمانی نەبوون"[3]

ئەمارەتە كوردییەكان كە بریتیبوون لە كۆنیفدراسیۆنی خێڵەكی و لــە ڕووی جوگرافییــەوە پارچــە پارچــە و نــە هــیچ كــەنالێكی پێكـــەوە بەنـــد و نـــە هـــیچ بنـــەوانێكی ئـــابووری پێكـــەوەی كۆدەكردنەوە. كۆمەڵگەیـەكی ترادسیۆن و ئابوورییەكەی بە پلـەی یەكەم پشتی بە شوانكارەیی و كشتوكاڵكاری دەبەست و لـە بڕێك ناوچـەی چیاییدا كـە لـە دوا ڕادەی هـەژاری دەژیـان، بـەجۆرێك لـە جۆرەكـان وادەبـوو ڕێگـری ئاڵیكـاری دەكـردن لـە مانـەوەدا. پرسـی هۆزەكـان بریتیبـوو لـە هەوڵـدانێك بـۆ دروسـتكردنی ئـەمارەتی سەربەخۆ بەڵام ئەستەمووڵ دەیزانی چۆن یاریبكات و چۆن یـەك دژی یەك بەشەریان دا بدات: " دوژمـنی سـەرەكی كوردێك هەمیشە هۆزەكەی ھاوسێیەتی"[4].

كۆمەڵگـەی ترادسـیۆنی كـورد كـە بـە ڕوپێكـی تایبـەتی لەسـەر شــــوانكارەیی و كــــشتوكاڵ دەژیــــا و جگــــە لــــەوەش لــــەناو گۆشەگیرییەكی تەواو و بەسەرخۆدا شكاوە دەژیا. كورد كـە بـەلای

[3] Martin Van Bruinssen, "*Les Kurdes, Etats et tribus*", In Hosham Dawod (sosu la dir.de), *Tribus et pouvoirs en terre d'islam*, Ed. Armand Colin, Paris, 2005, p.150.

[4] Georges Mutin, *Géopolitique du Monde Arab*e, Ed. Ellipses, Paris, 2001, pp. 93-94.

کەمییەوە لە سەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە ڕەعیەتی ڕاستەوخۆی کۆمیونیتەی موسلمانێتی بووە، کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی و بە بێ ئەوەی هیچ کەلەپورێکی کولتووریی ئاوا بەهێزی هەبێت، هەرگیز نەیتوانیووە بەشێوەیەکی سەربەخۆ ناسنامەی سیاسیی خۆی بسەپێنێ. هۆیەکەی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سیستمی کۆمەلایەتیی کۆمەڵگەی کوردەواری کە لەسەر عەشیرەتگەری و مۆدی بەرهەمهێنانی تەواو فیزیکییەوە سەرچاوە گرتبوو کە زۆربەی کات بەرهەمهێنان لەناوچە چیاییە دوورەپەرێز و دوور لەیەکەکان زۆر سەخت بووە[5]. لەناو ئەم فەزا داخراوە و ئەم سەرزەمینە چیاییە دوورە دەستانەدا بوار بۆ کاری بازرگانی یەکجار کەمە و دواجار ئەم دەروناوچانە بەهیچ شێوەیەك نابنە چاوگەی سەرهەڵدانی شاری گەورە بەمانای تەواو وشەکە و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان زۆر بە توونددی لەناو بۆتەی کۆمەڵگەیەکی نەریتخواز و فۆلکلۆری دا نوغرۆ دەبن. وەك تۆمابوا گوتەنی هۆزە چیاییەکان بەگشتی و هۆزە کوردەکان بە تایبەتی بە سێ سیمای سەرەکی دەناسرێنەوە: جیهانێکی بچووکی بەسەرخۆدا داخراو و ئۆرگانیزمێکی داکۆکیکردن. ئەم دام و دەزگایە خاوەنی ڕەوتێکی نەریتخواز و کۆنسیرڤاتۆرە[6].

[5] Jean-Paul Chagnollaud et Sid-Ahmed Souiah, *Les frontières au Moyen-Orient*, Ed. L'Harmattan, Paris, 2004., p. 45.

[6] Thomas Bois, *Connaissance des Kurdes*, Ed,. Khayats, Beyrouth, 1966, pp. 31-32.

کوردستان ناوچەیەکی چیایی بووە و ڕێگەوبانەکانی سەخت بووە و شاری وا گەورەی نەبووە و هەمیشە لە پەراوێزی دەسەلاتی ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێرانی دا ژیاوە و ئابوورییە سەرەکیەکەی هەر لەسەر شوانکارەیی بووە و لە ڕووی ئیداریشەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هەر لە پەراوێزی دەسەلاتی عوسمانی دا ژیاون و دابڕاو لەگەڵ دونیای دەرەوە پێوەندییە خێڵەکییەکان زۆر بە توندی بەیەکەوەی دەبەستنەوە و تا دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمیش تاك و تەرا ئەو ڕووناکبیرانەی کە هەیبوون لە شارە گەورەکانی وەك ئەستەنبوول، قاهیرە و میترۆپۆلەکانی ئەوروپادا دەژیان.

ئێمە کۆمەڵگەیەکی تا ناخی ئێسك عەشیرەتین و هیچ نهێنیش نییە کە، هەر بەراستی کوردستان بۆ خۆی مۆزایکی هۆز و تیرە و خێڵی جیاجیایە، کەچی بەداخەوە تا ئێستە نە لێکۆڵینەوەی ئاوا تێر و تەسەلمان بۆ سیستەمی هۆزایەتی کردووە و نە وەك پێویستیش بایەخمان بەو لایەنە داوە و ئەوەی لەوبارەشەوە نووسراوە بە پلەی یەکەم نووسراوی گەڕۆك و جاسووس و شۆفارەکانی ئینگلیزە کە بۆ مەبەستی تایبەتیی و نیازی داگیرکارانەی خۆیان چەند زانیارییەکیان بۆ بەجێهێشتووین کە ئەمڕۆ بۆ ئێمە بەخێر شکاوەتەوە و خێری داوەتەوە. ئەم ڕاپۆرتەی مێجەر سۆن کە لێرەدا کراوە بە کوردی و زانیارییەکانی لە ساڵەکانی جەنگیی یەکەمی جیهانی کۆکراونەتەوە و ساڵی 1918 لە چاپخانەی حکومەت لە بەغدا چاپکراوە و هەر بەڕاستی ئەمڕۆ ئەم کتێبە بۆتە دەسنووس و ( بەگوێرەی

بەدواداچوونەکانی ئێمە) تەنها دانەیەك کە پارێزراو بێ ئێستە لەناو ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا لەناو فایلی (151520) FO 371/ 3406 پارێزراوە* و من زۆر گەڕام نوسخەی دیکەم نە لە کتێبخانەی نیشتمانیی بریتانی و نە لە کتێبخانەی سواس و نە لە کتێبخانەی نیشتمانیی پاریس دانەم بەرچاو نەکەوت. بۆیە دوای کردنە کوردی ئەم ڕاپۆرتە پێمان باش بوو تەواوی ڕاپۆرتەکەش بە ئینگلیزی وەکوو خۆی چاپ بکەینەوە هەم بۆ دووبارە بەردەستخستنی نوسخەی ئینگلیزییەکە بۆ ناو کتێبخانەی کوردی و هەم بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێ بۆ کاری لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانی خۆیان بە ئینگلیزی سوود لە ڕاپۆرتەکە ببینن. دەمەوێ ئەوەش بڵێم کە ئەم ڕاپۆرتە هەر دوای بڵاوبوونەوەی چاپە ئینگلیزییەکە، ساڵی 1919 بە مەبەستی زانیاری کۆکردنەوە لەبارەی تیرە و هۆزە کوردییەکان و ناسینی کوردستان بۆ کاری شۆفاری کراوە بە فرانسی بەڵام وەرگێرانە فرانسییەکە ناتەواوە و کۆپیەکی ئەم ڕاپۆرتە بە فرانسی ئێستە لە ئەرشیڤی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا و ئەرشیڤی وەزارەتی جەنگیی فرانسا پارێزراوە و کۆپی دانەیەکیشی لە ئەرشیڤی ئێمەدا پارێزراوە کە من لە وەرگێڕانی ئەم ڕاپۆرتەدا، کەم و زۆر سوودم لە وەرگێراوە فرانسییەکەش وەرگرتووە.

دواجار دەبێ بەر لەهەرچی سوپاسی ئەرشیڤی نیشتمانیی بریتانی (لەندەن) بکەم بۆ ئیجازەی میهرەبانانەیان هەم بۆ لابردنی هەقی کۆپی رایت و هەم بۆ ڕێگە پێدان بۆ دووبارە چاپکردنەوەی

* The National Archives, (Kew). UK.

کتێبەکە بە ئینگلیزی. هەروەها لە بەراییدا سوپاسی زۆری برای بەڕێزم کاك سدیق ساڵح و مامۆستا ڕەفیق ساڵح دەکەم کە هاندەری گەورەم بوون بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمە و خوا کاریان ڕاستبکات و بۆ خزمەتی کتێبخانەی کوردی سەریان بخات. هەروەها سوپاسی هاوسەری خۆشەویستم فاتیمە ئەحمەد موراد دەکەم کە لە تایپکردنی تابلۆیەکان گەلێك کۆمەگی پێکردم و ماندووبوونی تایپیکردنی تابلۆیەکانی خستە ئەستۆی خۆی کە شایانی هەموو سوپاسێکمە. هەروەها گەلێك سوپاسی هێژا د. ئەمیری حەسەنپوور دەکەم کە کۆپییەکی خاوێنی ئەم ڕاپۆرتەی خستە بەردەستم، چونکو ئەو کۆپیەیەی کە من لە ئارشیڤی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیم وەرگرتبوو ئەوهێندە پاك نەبوو، بۆیە لە دڵەوە سوپاسی دەکەم. ماوەتەوە سەر ئەوەی بڵێم زۆر بەهیوام بە ئەمانەتەوە کاری وەرگێڕانەکەم ئەنجام دابێ و خۆ ئەگەر لە دووبارەی نووسینەوەی بڕێك لە ناوە زۆر و زەوەندەکانی هۆز و تیرە و شوێنە جیاجیایەکانی کوردستاندا هەڵەم کردبێ و سەرچیغ چووبم، ئەوا پێشەکی گەلێك داوای بەخشین دەکەم و دەکرێ لە چاپیەکانی داهاتوو ڕاستیان بکەینەوە.

نەجاتی عەبدوڵڵا

پاریس، 21ی ئایاری 2007

## سەرچڵێك

## لەبارەی ژیان و کارە کوردناسییەکانی

## مێجەر ئی.ب. سۆن

**(1923-1881)**

ناوی تەواوی ئێلی بانیستەر سۆن*–ە و لە 16 ی ئابی ساڵی 1881 لە کنزنگتن** لەدایك بووە. سۆن لە بنەماڵەیەکە کە پیاوەکانی بە دانایی و کەشخە و قۆزی بەناوبانگ بوون. ولیام سۆنی باوکی پیاوێکی زمانزان بوو و هەر زوو هێشتا تەمەنی سۆن نەبوو بوو بە دوو ساڵ کاتێك کۆچی دوایی کرد. ئێلی سۆن ساڵی 1889 دەچێتە قوتابخانەی بیشۆپی لاتیمەر Bishope Latymer's و ساڵی 1895 دەچێتە قوتابخانەی لاتیمەری باڵا

---

* Ely Bannister Soane

** Kensington

و تا شانزه سالی هەر لەو قوتابخانەیە Upper Latymer's دەمێنێتەوە. دواتر بە سەرکەوتوویی و بە پلەی شەرەف تاقیکردنەوەکانی Cambridge Local Junior سالی 1896 و تاقیکردنەوەکانی Senior Exams سالی 1897 دەبڕێ. سۆن لە دەورانی ژیانی قوتابخانەییدا وێرای ئەوەی کە لە قوتابخانە چەندین جار مێدالیای سەول لێدانی وەرگرتبوو کەچی هەرگیز هەوەسی بە یاریکردن نەدەهات، بەلام حەزێکی زۆری بۆ زمانی فرانسی هەبوو و وەك ئەکتەریش لە ئاهەنگەکانی قوتابخانە وەدیاردەکەوت و هەر زوو بەهرەی زمانزانی و لاساییکردنەوەی تێدا ڕەسکا کە ئەمە دواتر لە ئێران بە کەڵکی هات. سۆن خولیای ژەنینی ئامێری پیانۆ و ئۆرگەن-یشی هەبوو.

سۆن بەر لەوەی خوێندن تەواو بکات هەر لە سالی 1898-ەوە نیازی سەفەری ڕۆژهەلات لەسەری دابوو بەلام تا سالی 1902ئەم ڕێکەوتەی بۆ نەرەخسا. دوای ئەوەی کۆمپانیای (ئێچ، ئێس، کینگ)* کە وەك بانکی شەریکەی هیندی شەرقی بوو و وەکیلەکانی لەگەڵ بانکی لویدز** تێکەلاوبوون، بەمشێوەیە سۆن پێوەندی بە بانکی شاهەنشاهی ئێرانی*** دەکات و لە شوباتی سالی 1902 دەچێتە ئێران. سۆن لەم مێژووە بەدواوە جگە لە دووایین دوو سالی تەمەنی و چەند ماوەیەکی کەمی پشووەکانی بۆ ئەنگلستان، هەموو ژیانی هەر لە ڕۆژهەلات بەسەر دەبات. دوای چوونی بۆ ئێران ماوەیەکی کورت لە تاران بەسەر دەبات و دواتر

---

* H. S. King

** LIoyds Bank

*** Imperial Bank of Persia

دەچێتە (یەزد) و لەوێوەوە ساڵی 1903 دوای یەك ساڵ مانەوە لە یـەزد دەسـت دەکـات بـە وەرگێڕانـی چـوارینەکانی عومـەر خـەیام. ساڵی دواتر لە بوشەهر و پاشان لە شیراز دەبێتە ژمێریاری بانکی شاهەنشاهی ئێران. لەو ساتەوە سۆن خولیای ئایینی ئیسلامی دەکەوێتە سەر و دەچێتە مزگەوتەکان و جلی ئێرانی دەپۆشی و لەگـەڵ ئاخونـدەکان دەکەوێتـە وتوێـژ و دواجـار سـاڵی 1905 دەچێتە سەر ئایینی ئیسلام و دەبێتە شیعە. ساڵی 1906 دەبێتە بەڕێوەبەری لقی بانکی شاهەنشاهی ئێران لە کرماشان و لێرەوە دەسـتدەکات بـە فێربـوونی زمـانی کـوردی و لێکۆڵینـەوە لـەبارەی گـەلی کورد. دواتـر لـە سۆنگەی ناکۆکیی توندی لەگـەڵ کۆنسڵی ڕووسیا لەوشارە هێندە لە پۆستەکەی نامینێتـەوە و ساڵی 1907 واز لـە بانکەکـە دەهـێنێ و بـۆ ماوەیـەکی کـورت دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەنگلستان. ئەمجارە کە لە لەندەن دەگەڕێتەوە بەناوی خوازراوەی مـیرزا غـولام حوسـێن شـیرازی گەشـتێکی دوورودرێـژ بـەناو میزۆپۆتامیا و کوردستان دا دەکات و بەرهەمی ئەم گەشتەی ئەم کتێبە نایابە بوو بە ناوی ( گەشتێك بۆ میزۆپۆتامیا و کوردستان بە جل گۆڕاوی.، لەگەڵ چەند سەرنجێکی مێژوویی لەبارەی هۆزە کوردییـەکان و کلدانییـەکانی کوردستان)* کـە ساڵی 1912 یەکەم چاپ و ساڵی 1926 دووەم چاپی بلاوکرایەوە.

سـۆن سـاڵی 1909 بـە جلـی ئێرانـی لـە خوڕەمـشەهر سـەردەردەکاتەوە و کۆتـایی هـەمان سـاڵ پێوەنـدی بـە سـتاف

*To Mesipotamia and Kurdistan in disguise; With historical notes of the Kurdish tribes and the Chaldeans of Kurdistan*

(کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-ئێرانی)** دەکات لە هەمان شاردا و دوای چەند مانگێك دەینێرن بۆ چیای سورخ لە نزیك خانەقی و لەویوەوە دەست دەکات بە کاری گەڕان بەدوای نەوتدا. بۆ ڕێزگرتن لە توانای سۆن و ئەو خزمەتە زۆر و زەوەندەی کە بۆ کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-ئێرانی کردبوو ساڵی 1913دەکرێتە جێگری کۆنسلی بریتانیا لە قەسری شیرین، شارێکی چکۆڵەی ئێران لەو دیوو سنوور نزیك بە چیای سورخ. دەگێڕنەوە جارێك فەتاح بەگ کە پێش ئەوەی سۆن بچێتە قەسری شیرین لە بەرامبەر "پارێزگاری کردن" لە کێڵگەکانی نەوت مانگانەیەك وەردەگرێ. هەر کە مێجەر سۆن دەگاتە ئەوێ لە ناکاو پارەکەی دەبڕێ. ئەوکاتە فەتاح بەگ نووسراوێك بۆ سۆن دەنێرێ و هەڕەشەی لێدەکات و داوای لێدەکات دەم و دەست ئەو پارەیەی کە نەدراوە بۆی بنێرێ ئەگەر نا فەتاح بەگ ناتوانێ کۆنترۆڵی هۆزەکەی بکات. کاتێك دوو تەتەرەکەی فەتاح بەگ دەگەنە کێڵگەی نەوت، سۆن دەیانگرێ و چەك و ئەسپەکانیان لێدەسەنێ و بە چەککراوەیی بۆ فەتاح بەگ یان دەنێرێتەوە تا ئەو پەیامەی پێبڵێن: " ئەگەر دەیەوێ شەڕبکات ئەوا ئێستە دوو چەکی لەوەی پێشوو کەمترە لەکاتێکدا ئەو دوو چەکی زیاتری هەیە". فەتاح بەگ بەر لەوەی بەرەو ڕووی شەڕ بێتەوە بڕیار دەدا خۆی بچێتە لای سۆن. لە کێلگەی نەوت مێجەر سۆن ڕێز لە فەتاح بەگ دەنێ و دەکەوێتە ژێر کەسایەتی بەهێزی فەتاح بەگ، بۆیە کێشەی پارە هەرگیز نەوروژێنرا و فەتاح بەگ گەڕایەوە ناو هۆزەکەی و ئەم

** Anglo-Persian Oil Company

هاوڕێیەتییەی نێوان فەتاح بەگ و سۆن تا مردنی ئەوەی یەکەم هەر بەردەوام بوو.

سۆن پیاوێکی کورتەبنە، تۆکمە و سیما باریکەلەی چاو ڕەشی تیـژ بـوو. هـەر زوو ئـەم هێـزی کەسـایەتییە لەسـەر زەوی واقیـع حسابی بۆکرا و بە تایبەت لەو جێگەیانەی کە دەسەڵاتی تورکی وەکوو دەسەڵاتی ئێرانی لەو دیوو سنووری شارە گەورەکان هەر تـەنها شـتێکی ڕەمـزی بـوو. سـۆن لـەکاتی هەڵگیرسـانی جـەنگیی یەکـەمی جیهـانی لـە بەغـدا دەبـێ و لەگـەڵ 20 ئـەوروپی دیکـە زینـدانی دەکرێ و دواتـر هـەڵوەدای مەرسـینیا* دەکـرێ و زۆربـەی ئەو ماوە ڕێگەیان هەر  بە پێیان پێ دەبڕن. دوای چەند هەفتەیەك مانـەوە لـە مەرسـینیا وەکـو هـەموو ئەوروپییـەکانی دیکـە ئـازاد دەکرێ و یەکسەر دەگەڕێتەوە میسر. زانیاری زۆر وردی لەبارەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت و شـارەزایی لـە ناوچـەکە وایـان لێکـرد سەرنجی فەرماندەیی هێزی لەشکرکێشی* بۆ خۆی ڕابکێشێ و لە دەستپێکی ساڵی 1915 دەست بەکار دەبێ و دواتر ساڵی 1916 دەیهێننـە بەسـرە. دوایـی ماوەیـەك بـۆ ڕاهێنـان لـە دائـیرەی جاسووسـکاری خـەریك دەبـێ و دواتـر دەیکەنـە نووسـەر لـە ڕۆژنامەی بەسرە تایمز *Basrah Times* کە ڕۆژنامەی حکومەتی بوو و بە ئینگلیزی و عەرەبی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەردەچوو و دواتر چاپی فارسی–یشی هاتە سەر. هەر زوو بۆ کردەیەکی سـەخت نێـردرا بـۆ لای بەختیارییـەکان تـا بەشـوێن جاسـووس و

* Mersina
* Expeditionary Force

**شۆفارە تورك و ئەڵمانییەکاندا بگەڕێ و بێدەنگیان بکات. سۆن بە هاوەڵی شەش پاسەوانی کورد و فارس توانی (ئەرکەکە) بە سەرکەوتوویی ڕایی بکات.**

**سۆن سەرەتای ساڵی 1916 بوو بە جێگری کۆنسلی بریتانیا لە دێزفول. دوای داگیرکردنی بەغدا لە ئاداری 1917 دوای ئەوە ماوەیەك لە بەغدا دەمینێتەوە. لەبەر ئەوەی تا دیسامبەری 1917 خانەقی هیچ شێوە بەڕێوەبردنێکی مەدەنی ئینگلیزی لێنەبوو کە، دوای ئەوە بۆ یەکەمجار لە لایەن هێزەکانی بریتانییەوە داگیرکرا، ئینگلیز کاروباری ناوچەکانی خانەقی و دەوروبەری بە مێجەر سۆن دەسپێرن. خانەقی ئەو سەروبەندانە بە دەست سوپای تورکیا و ڕووسیا، بە تایبەت بەدەست ئەمەی دواییان بوو بوو بە وێرانە و برسێتییێکی وای تێدا بڵاوبووبۆوە کە لە وەسفکردن نەدەهات. سۆن لەو شارە هەڵمەتێك بۆ فریاکەوتنی برسیەکانی جەنگ ڕێکدەخات. هەر لەوساڵانەی مانەوە و کارکردنی لە خانەقی کەرەسە و مەتریالی ئەم کتێبەی لەبارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو کۆکردۆتەوە و زانیارییەکانی تەواو ورد و جێگەی بایەخن. لەبەر زۆری خزمەتەکانی بۆ حکومەتی بریتانی ویسامی C.B.E ی پێدەبەخشن. سۆن لە نیسانی 1918 تووشی نەخۆشی کوشندەی دەردەباریکە دەبێ و دەییەخێ. دوای چەند هەوتوو مانەوە لە نەخۆشخانە لەسەر داوای بە پەلەی خۆی ڕەوانەی ئوستralیا دەکرێ بۆ چارەسەریکردن و دوای شەش مانگ دەگەڕێتەوە و بە ڕواڵەت لە نەخۆشیەکەی چاك دەبێتەوە. لە سەرەتای ساڵی 1919 کاروباری ناوچەی سلێمانی پێدەسپێرن و**

هێندە نابات سۆن و شێخ مەحموود تێکگیردەبن و دواتر ئینگلیز بە ئاگر و ئاسن دەکەونە دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینە چەکدارییەکەی شێخ مەحموود.

سۆن پیاوێکی تەبیعەت وشك و ئاغر بوو و لە بارەگەکەی خۆی نەدەچووە دەرەوە، سۆن کەم دەردەکەوت و بەمە دەیویست سامێك بۆ خۆی پەیدا بکا. خۆ کە دەریش دەکەوت و یا بە بازاردا دەڕۆیشت دەبوو خەڵکەکە بە جارێ هەستنە سەرپێ و ڕێبوار کڕنۆشی بۆ بکا، بەلاّم لەگەڵ ئەوشدا لە ماوەی 18 مانگی حوکمڕانی سۆن لە سلێمانی تەنها یەك کەس لە سێدارە درا ئەویش خەڵکی کوشتبوو. جگە لەوە سۆن ڕێگە وبانی هەڵدەنا و دەیەویست متمانە بگەڕێنێتەوە ناو خەڵك و قوتابخانەی دەکردەوە. لە ناوچەی سلێمانی خوێندنی کردە کوردی و هەموو هەوڵێکی دەدا ئیدارەی ناوەخۆیی لە ناوچە کوردییەکاندا شێوازێکی تەواو کوردانە بەخۆوە بگرێ و تەواوی کارمەندەکانی ناوچەکە کورد بوون و خۆیشی جگە لەوەی شارەزاییێکی تەواوی لە زمانی فارسیدا هەبوو بە کوردییێکی زۆر تەواو قسەی دەکرد و هەموو دیالێکتەکانی کوردیشی دەزانی. هەر ئەویش بوو جل و بەرگ پۆشینی کوردیشی کردبووە ناچاری و ڕێگەی نەدا چیتر ناوی شاری (سلێمانی) بە شێوەی (سلێمانیە) بنووسرێ.

دەکرێ ئەوە بڵێن کە وەختایەك سۆن گەیشتە کوردستان، نووسینی کوردی زۆر بە دەگمەن دەنا هەر نەبووە. دەبێ ئەو ڕاستییەش بگوترێ کە سۆن ڕۆڵێکی یەکجار گەورەی بینی لە جیهانی ڕۆژنامەوانیی کوردی و هەر بەڕاستی خاوەنی یەکەم

ڕۆژنامەی کوردی بوو لە کوردستانیی خواروو (تێگەیشتنی ڕاستی – بەغدا 1918) دواتریش لە ڕێگەی ڕۆژنامەی پێشکەوتن خزمەتێکی زۆری زمانی کوردیی نووسینی کرد. سۆن یەکەم کەسە کە فرمانی دا لە سلێمانی بە کوردی ڕۆژنامە دەربچێت. (ڕۆژنامەی پێشکەوتن) یادگاری (سۆن)ە و زمانی کوردی بەهۆی ئەم ڕۆژنامە تاقانەیەوە لە (سلێمانی) دا هاتە نووسین و خوێندنەوە و هەر بە هاندانی (سۆن) هەندی لە نووسەرەکانی ئەو ڕۆژەی سلێمانی کەوتبوونە سەر بیر و مەیلی نووسینی کوردیی پەتی. تەنانەت (سۆن) بۆ ئەمە (پاداشت)ێکیشی دانابوو و ئەوانەی کە نزیکەی لاپەرەییێکیان لەهەر باسێك بە کوردی پەتی ئەنووسییەوە لە (20) تا (30) ڕوپیە (پاداشت)ی پێ دەبەخشین. دواتریش دوای ئەوەی سالّی 1921 گەڕایەوە ئەنگلستان وێرای ئەوەی کە نەخۆشی دەرەتانی لێ بڕیبوو کەچی هەر خەریك بوو کەرەسەی فەرهەنگێکی کوردی–ئینگلیزی کۆدەکردە و سەرقاڵی لێکۆڵینەوەییێکی زمانەوانی تایبەت بە زمانی کوردی بوو کە ئێستە دەستنووسەکە لە کتێبخانەی لێکۆڵینەوە ڕۆژهەلاتییەکان لە Finsbury Circus پارێزراوە. لە تشرینی دووەمی سالّی 1922 لەسەر ڕاسپاردەی پزیشکەکان دەنێردرێ بۆ بیزێرتە *، بەلاّم تا ئەو ڕادەیە نەخۆش بوو کە ئامۆژگاری دەکەن بۆ ڕاوێژی پسپۆری پسپۆر بگاتەوە لەندەن، بەلاّم مەرگ ڕێگەی نادات و هەر لە ناو زەریا لە ڕۆژی 24 ی شوباتی 1923 کۆچی دوایی دەکات.

* Bizerta

## سەرچاوەکان


1-E.B. Soane- A Memoir, by Sir Arnold T. Wilson, In *To Mesipotamia and Kurdistan in disguise: With historical notes of the Kurdish tribes and the Chaldeans of Kurdistan ( With a memoir of the author by Sir Arnold T. Wilson)*, London, 2d ed, J, Murray, &çé-, pp. IX-XVII.

2-Arnold T Wilson, *Mesopotamia 1917-1920: A Clash of Loyalties: A Personal Historical Record*, Ed. Oxford University Press, 1931.

**3- ڕەفیق حلمی، یادداشت: *کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحموود*، بەشی یەکەم، چاپی دووەم، هەولێر،** 1988.

# بیبلیۆگرافیای

# کرۆنۆلۆژی کارە زانستییەکانی مێجەر سۆن

# لەبارەی کوردەوە

**1909**

1- *Notes on a Kurdish dialect, the Shadi branch of Kermanji*, In: J. R. A. S, London, Pt IV. pp: 895-921.

2-*A Southern Kurdish folksong in Kermanshahi dialect*[7], In: J. R.A. S, London, Pt I. pp: 35-51

**1912**

3-*To Mesipotamia and Kurdistan in disguise; With historical notes of the Kurdish tribes and the*

---

[7] **ئەم وتارە لە لایەن ئەنوەری سولتانی کراوە بە کوردی، بڕوانە: قەتاری کوردی کرماشان، گۆواری "مەڵبەند"، لەندەن، ژمارە 53، لا: 10–11 و ژمارە 54، لا: 14–15**

*Chaldeans of Kurdistan*, London, Fist Edition, J. Murray, (IX+421 p), 6 ill, 1 map[8].

4-*Notes on a Kurdish dialect, Sulaimania (Southern Turkish Kurdistan)* In : J. R. A. S, London, Pt IV, pp. 891-940

## 1913

5-*Grammar of the Kurmanji of Kurdish language*, London, Luzac, ( Luzac's Oriental Grammar Series,N°6),XVI+289p[9].

## 1918

6- *Notes on the tribes of southern Kurdistan*, Baghdad: Printed at the government Press, (40 p)[10].

7- *Report on the Sulemania District of Kurdistan*, Calcutta: Superintendent government printing press (161 p).

**8- ڕۆژنامەی "*تێگەیشتنی ڕاستی*"، بەغدا، سێشەممە، 1 ی کانوونی دووەمی 1918 تا ڕۆژی 27 ی کانوونی دووەمی**

---

[8] **ئەم کتێبە تەرجەمەی ڕووسی و عەرەبی کراوە، بەداخەوە تا ئێستە ئەم کتێبە نایابە کە لە هەموو ڕووییێکەوە شایستەی ئەوەیە ڕاستەوخۆ لە ئینگلیزییەوە بکرێتە کوردی، کەچی تا ئێستە نەکراوە بە کوردی، وەرگێڕ.**

[9] **مەکەنزی بەم کتێبەدا چۆتەوە بڕوانە:** D.N. Mackenzie, *Kurdish Dialect Studies*, 1961, p. XIX.

[10] **ئەمەیان ئەم کتێبەی بەردەستتانە، وەرگێڕ.**

1919، بەسەر یەکەوە (67) ژمارەی لێدەرچووە. ئەم ڕۆژنامەیە زمانحال و ئۆرگانی پرۆپاگەندەی ئینگلیز بوو لەناو کورد دا و هەموو سەرچاوەکان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە سۆن بەڕێوەبەر و یەکەم نووسیاری ڕۆژنامەکە بووە[11].

**1919**

9-*Elementary Kurmanji grammar (Sulaimania district)*, Baghdad, (197 p)[12].

**1920**

10- ئەوەلین قرائەتی کوردیی، محەمەد باشقە و محەمەد ئەمین زەکی، بەهۆی مێجەر سۆن و ج. فاربێل تەطبیق کراوە و دائیرەی مەعاریفی بەغدا پەسندی کردووە و بڵاوی کردۆتەوە و لە چەپەوە بۆ ڕاست دەستپێدەکات. 30 لاپەڕەیە، بەغدا، چاپخانەی حکومەت[13].

---

[11] بڕوانە: د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، ***تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا***، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1978، لا: 137

[12] مەکەنزی بەم کتێبەدا چۆتەوە بڕوانە: D.N. Mackenzie, *Kurdish Dialect Studies*, 1961, p. XIX.

[13] بڕوانە: نەریمان، ***بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردیی 1787-1975***، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، 1977، لا: 18-19

## 1921

11- *A short anthology of Guran poetry*[14], In J.R.A.S, London, pp. 57-81.

## 1922

12- *Notes on the phonology of Southern Kurmanji*, In J.R.A.S, London, Pt II, pp. 191-226.
13- *The Southern Kurds*, In JRCAS, London, Vol. IX, Pt I, pp. 40-47

## 1923

14- *Evacuation of Kurdistan; an ill-fated expedition*, In JRCAS, London, Vol. X, Pt I, pp73-74

15-*The Tale of Suto and Tato*[15], In Bulletin of School

---

[14] پێشەکی ئەم وتارە لە لایەن ئەنوەری سولتانی لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی، بڕوانە: مێجەر ئی.بی. سۆن: "بەیازێکی بچووکی شیعری گۆرانی" لە کتێبی " کەشکۆڵە شیعرێکی کوردی (گۆرانی)، گردە کۆیی شێخ عبدالمومنی مەردۆخی، ساغ کردنەوە و سەرەتانووسینی: ئەنوەری سولتانی، تراستی سۆن بۆ کوردستان، لەندەن، 1998، لا: 431–434

[15] ئەم چیرۆکە ساڵی 1988یوسف زەنگەنە و جەواد مەلا کردوویانە بە کورمانجی خواروو و دوایی هێناویانەتە سەر تیپی لاتینی. بڕوانە: *چیرۆکی سۆتۆ و تەتۆ*، کۆکردنەوە و بە ئینگلیزیکردنی: مێجەر سۆن و باسیل نیکیتین، بە کورمانجی خوارو و لاتینی کردنی: یوسف زەنگەنە و جەواد مەلا، بڵاوکراوەکانی کوردۆلۆژیا، ژمارە 7، لەندەن، 1988. ئێمە لە بەرگی یەکەمی

of Orient and African Studies, Vol I, London, pp. 69-106.

## 1926

16-*To Mesipotamia and Kurdistan in disguise: With historical notes of the Kurdish tribes and the Chaldeans of Kurdistan ( With a memoir of the author by Sir Arnold T. Wilson)*, London, 2d ed, J, Murray, XXI+421 p, 11 ill; 1 map. Bibliography: p. 409-410.

## 1955

17-*Kurdish-English wordlist (Suleimaniye dialect)*, handcopy made by D.N. and G. Mackenzie, (Kurdish transliterated in roman script), London[16]

---

**کتێبی (بازیل نیکیتین و کوردناسی) ئەم چیرۆکەمان وەکوو خۆی بڵاوکردۆتەوە، بڕوانە: نەجاتی عەبدوڵڵا، *بازیل نیکیتین و کوردناسی*، بنکەی ژین، سلێمانی، 2004، لا: 188–212**

[16] **ئەم کتێبە کە دوایین کاری مێجەر سۆن بوو لەبارەی زمانی کوردی و تەرخانی دیالێکتی (سلێمانی) کراوە و لە دوادواییەکەی ژیانی نووسیوویەتی و ساڵی 1955 مەکەنزی دووبارە ئەم دەستنووسە بە چەند دانەیەکی کەم بڵاو دەکاتەوە کە ئێستە دانەیەك لەم کتێبە لە کتێبخانەی سواس SOAS لە لەندەن پارێزراوە، وەرگێڕ.**

**1979**

18-*To Mesopotamia and Kurdistan in disguise : narrative of a journey from Constantinople through Kurdistan to Baghdad, 1907-1909 with historical and ethnographical notices of the various Kurdish tribes and of the Chaldaeans of Kurdistan*, and an index , Repr. of the 2nd ed. of 1926, Ed. St Helier : Armorica Book Co.

**کورتکراوەکان:**

JRCAS:*Journal of the Central Asian Society*
JRAS:*Journal of the Royal Asiatic Society*

# NOTES

ON THE

# TRIBES OF SOUTHERN KURDISTAN

BY

MAJOR E. B. SOANE,
*Political Officer, Khaniqin,*
*M.E.F.*

*1918.*

BAGHDAD:
PRINTED AT THE GOVERNMENT PRESS.
1918.

بەرگی دەرەوەی کتێبە ئینگلیزیەکەی سۆن

# NOTES ON THE TRIBES OF SOUTHERN KURDISTAN.

## (1) BAJLAN.

(*a*) Tribe (*b*) Family of Bajlan.

Sections.—Jumur and Qazanlu.

Sub-sections of Jumur are Saikawand, Hajilar, Gharibawand, Shirawand, Charkalao, Mamawand, Daudawand and Jalil Agha.

Sub-sections of Qazanlu are Haji Khalil, Wali Agha, Abdurrahman Agha.

Chiefs of the Jumur.—Majid Khan, Parviz, Mubarak, Jahanbakhsh, Qadir Agha, Muhammad Amin Agha.

Chiefs of the Qazanlu.—Wali Agha, Abdurrahman Agha, Ghaidan Agha, Haji Khalil Agha.

Strength.—About 1,300 families. Majid Khan had before the war about 80 horsemen and Muhammad Amin Agha with Wali Agha about 400. At present the tribe is dispersed and has no strength.

Location.—(*a*) Jumur.

In the so-called plain of Bajlan bounded

N. The Abbasan stream

S. The Qasr i Shirin-Kermanshah road

E. The hills Dar i Diwan and Bishikan

W. The Sirwan river and Agh Dagh Hill.

لاپەرەی یەکەمی کتێبە ئینگلیزیەکەی سۆن

# چەند سەرنجێك

# دەربارەی

# هۆزەكانی كوردستانی خواروو

نووسینی

مێجەر ئی.بی. سۆن

ئەفسەری سیاسی، خانەقی

فەرماندەیی گشتیی هێزی لەشكركێشی میزۆپۆتامیا

1918

بەغدا:

لە چاپخانەی حكومەت چاپكراوە

1918

---

وەرگێڕانی دەقاودەقی سەر بەرگی كتێبە ئینگلیزییەكە